


# شەو نوێژ



نوسینی
سرکوت کمال علی

وەرگێرانی
إسماعیل طه



# شەونوێژ

نوسینی

سەرکەوت کەمال عەلی

وەرگێڕانی

إسماعیل طه

چاپی دووەم



| | |
|---|---|
| ناوی کـتێـــــب: | شەونوێژ |
| نوســــــــەر: | سەرکەوت کەمال علی |
| وەرگێڕانـــــــی | اسماعیل طه |
| بـڵاوکردنـــەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە / هەولێر |
| دیزاینی نـــاوەوە: | شنۆ حمدامین |
| خـــــــــەت:س | نەوزاد کۆیی |
| بــــــــەرگ: | ئەمیـن مخـلص |
| نۆرە و ساڵی چـاپ: | دووەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز |
| تـــــــیراژ: | (٢٠٠٠) دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە سلێمانی ژمارەی سپاردنی (١٨٤٥) ی ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ




بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر لوتکەی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٢٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده، ونستعينه، ونستغفره، وَنعوذ بالله من شرورأنفسنا، ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهدُ أنَّ محمداً عبده ورسوله.

لەم کتێبەم بابەتی شەو نوێژم باسکردوە، کە شەو نوێژ یەکێکە لە بابەتە گرنگەکان، کە پێغەمبەری پێشەوامان سوربوە لەسەر بەجێگەیاندنی.

خوایە بمانکە بەو کەسانەی، کە لەبارەیانەوە، دەفەرموێت: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ...( ئەو ئیمانداره بەختەوەرانە) نێوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەی گەرم و نەرما(واتە: نوێژو خوا پەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر)هەمیشەنزاو

پاڕانەوەیان ڕوو بە پەروەردگاریانە لەخەشم و قینی دۆزەخی دەترسن، ئاواتی ڕەزامەندی و بەهەشتیان هەیەو لەرزق و ڕۆزیو توانایی زانیاریەی پێمان بەخشیون﴾سجدە: ١٥.

هەروەها لەو کەسانەش بێت، کە لە بارەیانەوە دەفەرموێت:﴿ ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ...جا ئەو ئیماندارانە، ئەمەیە سیفەتیان، خۆگرو ئارامگرن لە بەرامبەر ناسۆر ناخۆشیەکانی ژیانەوە، ڕاستگۆ و خواپەرستن، ماڵ و سامان دەبەخشن و، لە بەرەبەیانەکاندا داوای لێخۆشبون (لە پەروەردگاریان دەکەن، کە وەك پێویست خواپەرستیان نەکردوە)﴾ آل عمران(١٦).

# ئەم ئایەتانەی لە قورئاندا لە بارەی شەو نوێژ لە هاتون

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ۝٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ...ئەی ئەوکەسەی خۆت داپۆشیووە، ئەی محمدﷺ، ٭ شەو هەستە نوێژ بکە، مەگەر کەمێکی نەبێت٭ نیوەی، یان کەمتر لە نیوەی لێ کەم بکەرەوە٭ یاخود زیاتری بکە دەوری قورئان بکەرەوە بەوردی و لە سەر خۆ﴾المزمل ١ـ٤.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ

وَءَاخَرُونَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ... بەڕاستی پەروەردگارت چاك دەزانێت، كە نزیكەی دووبەشی شەو یاخود نیوەی، یان سێیەكی هەڵدەسیت و شەونوێژ دەكەیت، هەروەها هەندێك لەوانەی لەگەڵتان، خوا ئەندازەی شەوو ڕۆژ دیاری دەكات، خوا زانیوەیەتی، كە ئێوە هەرگیز نازانن دیاریی بكەن و ئاماری بكەن، ئەگەر ئەو نەیكردایە، لە بەرئەوە تەوبەی لێوەرگرتن، جا چەندتان توانی و چۆنتان بۆ لوا لە شەونوێژ لەكاتی تردا قورئان بخوێنن و دەوری بكەنەوە، چونكە ئەو خوایە میهرەبانەو دەزانێت، لەوانەیە كەسانێكتان لێ نەخۆش بكەوێت و كەسانی تریش بێن لە زەویدا بگەڕێن بەشوێن بازرگانی و فەزڵی خوداو كەسانی تر لە داهاتوودا بجەنگەن بۆ لابردنی كۆسپەكانی سەر ڕێی دینی خواو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو، كەواتە

چەندەتان بۆ کرا، ئەوەندە قورئان بخوێنن و نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش (بە شێوەیەی دیاریکراوە) بیدەن و قەرز بەشێوەیەکی جوان بەخوا دبدەن(ئەوەی بۆخوابەخشرێت خوای گەورە بەقەرزێکی دادەنێت، کە بەزاتی خوی درابێت) هەر دەست پێشکەریەکی چاکە بکەن، بۆ خۆتان سبەی دەیبەنەوە لای خوا، دەستان دەکەوێتەوە بە باشترو پاداشتی گەورەتر، دە داوای لێخۆشبوون هەر لە خوا بکەن و دڵنیا بن ئەوخوایە لێخۆشبو میهرەبانە﴾المزمل ٢٠.

هەروەها لە سورەتی ذاریات لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ...لەشەوگاردا زۆر کەم دەخەوتن و رادەکشان(چونکە سەرگەرمی شەونوێژ و دەورکردنەوەی قورئان ویادی خوان* لە بەرەبەیانیشدا داوای لێخۆشبونیان لە پەروەردگاریان دەکرد (تالێیان ببورێت) ﴾الذاریات: (١٧ـ ١٨).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴿٨٠﴾ وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ...(ئەی پێغەمبەرﷺ ئەی ئیماندار) نوێژ ئەنجام بدە کاتێك خۆر نیوەی ئاسمان بەجێ دەهێڵێت(ئاماژە بە نوێژی نیوەڕۆو عەسر) لە تاریکی شەویشدا نوێژی مەغریب و عیشا ئەنجام بدە، نوێژی بەیانیانیش (کە زۆر قورئانی تێدا دەخوێنرێت فەرامۆشی مەکە) کە بەڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی دەبینرێت لە لایەن فریشتەکانەوە* لە بەشێکی شەودا خۆت ماندو بکە بە دەورکردنەوەی قورئانەوە لە شەونوێژدا، کە زیادە

ئەرکێکە لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ، بۆ ئەوەی پەروەردگارت بتخاتە شوێن وجێگەی بەرێزەوە، کە تێیدا سوپاسکراوبیت* بڵێ: پەروەردگارا یارمەتیم بدە، تا هەر کاتێك دەست بەرداری (هەرخێرێك بووم) بەچاکی و ڕاستی و دروستی ئەنجامی بدەم و لە هەرکارێك بوومەودو ئەنجامدا سەرەنجامێکی چاکی هەبێت بە جوانی لێی دەرچم و هەمیشە بەردەوام لە لایەن خۆتەوە دەسەڵاتێکم پێ ببەخشە،کە ببێتە هۆی سەرکەوتنی بەردەوامم*هەروەها بڵێ: تازە ئیتر حەق و ڕاستی هاتووە و بەرپابووە بەتاڵ و ناحەقی، پوچ و تەفرو تونا بوە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەر تیاچووەو جێگیر نەبووەو بەزیوە﴾ الإسراء ٧٨ـ٨١.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ... ئینجا بەردەوام یادی پەروەدرگارت بکەو ناوی پیرۆزی با ویردی سەرزارت بێت، لە بەرەبەیان و

دەمە و ئێواراندا﴾ لە شەوگاریشدا سوژدەی بۆ ببەو تەسبیحات و ستایشی لە هەندێکی شەودا زۆربکە﴾ الإنسان ٢٥.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَـٰرَ ٱلسُّجُودِ...لە شەوگاریشدا تەسبیحات و ستایشی خوا بکە، هەروەها لە دوای نوێژەکانیش﴾سورة ق٤٠.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَـٰرَ ٱلنُّجُومِ...لە شەوگاریشدا هەر بیپەرستە و ستایشی بکە، هەروەها کاتێك ئەستێرەکان ون دەبن لە چاو دیار نامێنن﴾ سورة الطور٤٩.

خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ

جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ... بەڕاستی تەنها ئەوانە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دەهێنن، کاتێکدا یاوەری دەکرێن پێی، خێرا سوژدە دەبەن تەسبیحات و سوپاسگوزاری پەروەردگاریان دەکەن، لە کاتێکدا ئەوانە بەهیچ شێوەیەك فیزیان نیەو خۆیان بەگەورە نازانن* (ئەو ئیماندارانە بەختەوەرانە) نێوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەی گەرم و نەرما(واتە: نوێژ و خواپەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر) هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان ڕوو بە پەروەردگاریانە لە خەشم و قینی دۆزەخی دەترسن،ئاواتی ڕەزامەندی و بەهەشتیان هەیەو لە رزق و ڕۆزی وتوانایی ئە زانیاریەی پێمان بەخشیون ﴾ السجدة١٥ـ١٦.

خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ...بەڕاستی خـۆ پێگەیانـدن لـە شـەودا

قورسترە لە ڕووی کرداروو باشترە لە ڕووی گوفتاردوە ﴾ المزمل ٦.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ... لەشەوگاردا زۆر کەم دەخەوتن و ڕادەکشان(چونکە سەرگەرمی شەونوێژ و دەورکردنەوەی قورئان ویادی خوان﴾ الذاریات١٧.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ... جا ئەو ئیماندارانە، ئەمەسیفەتیانە، خۆگرو ئارامگرن لە بەرامبەر ناسۆر ناخۆشیەکانی ژیانەوە، ڕاستگۆ و خواپەرستن، ماڵ وسامان دەبەخشن و، لە بەرەبەیانەکاندا داوای لێخۆشبون لە پەروەردگاریان دەکەن، کە وەك پێویست خواپەرستیان نەکردوە﴾ال عمران ١٧.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَـٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ

هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ... (ئا ئەو جۆرە کەسانەی، کە باسکران چاکترن) یان ئەو ئیماندارانەی لە دووتوێی شەوگاردا هەڵدەستێت بۆ خواپەرستی، سوژدە دەبات و بە پێوە دەوستێت، لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێت و ئومێد و هیوای بەمیهرەبانی پەروەردگاری هەیە، ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ: ئایا ئەوکەسانەی، کە دەشزانن و شارەزان، وەك ئەوانەن، کە هیچ نازانن و شارەزاییان نیە؟ بەڕاستی تەنها خاوەن بیروهۆشەکان لەم جۆرە یادەوەریانە سود وەردەگرن و تێدەگەن لە حەقیقەتی دنیاو قیامەت، دڵنیان ژیانی دنیافرسەتێکی بەنرخە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوابەکاری دەهێنن﴾الزمر٩.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ ... لە کاتەکانی شەودا ئایەتەکانی خوادەخوێننەوەو نوێژدەکەن و سوژدە دەبەن بە هەموو واتایەك موسڵمانن﴾ آل عمران١١٣.

خوای گەورە دەفەموویت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ﴾... بەڕاستی ئەو پەروەردگارت چاك دەزانێت، کە نزیکەی دووبەشی شەو، یاخود نیوەی، یان سێیەکی هەڵدەسیت و شەونوێژ دەکەیت، هەروەها هەندێك لەوانەی لەگەڵتان، خوا ئەندازەی شەوو ڕۆژ دیاریی دەکات، خوا زانیوەیەتی، کە ئێوە هەرگیز نازانن دیاریی بکەن و ئاماری بکەن، ئەگەر ئەو نەیکردایە، لە بەرئەوە

تەوبەی لێوەرگرتن، جا چەندتان توانی و چۆنتان بۆ لوا لە شەونوێژ لەکاتی تردا قورئان بخوێنن و دەوری بکەنەوە، چونکە ئەو خوایە میهرەبانەو دەزانێت، لەوانەیە کەسانێکتان لێ نەخۆش بکەوێت و کەسانی تریش بن لە زەویدا بگەڕێن بەشوێن بازرگانی و فەزڵی خوداو کەسانی تر لە داهاتوودا بجەگن بۆ لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێی دینی خواو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو، کەواتە چەندەتان بۆ کرا، ئەوەندە قورئان بخوێنن و نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش (بەو شێوەیەی دیاریکراوە) بیدەن و قەرز بەشێوەیەکی جوان بەخوا بدەن (ئەوەی بۆخوا ببەخشرێت خوای گەورە بەقەرزێکی دادەنێت، کە بەزاتی خوی درابێت) هەر دەست پێشکەریەکی چاکە بکەن، بۆ خۆتان سبەی دەیبەنەوەلای خوا دەستان دەکەوێتەوە بەباشتر و پاداشتی گەورەتر، دە داوای لێ خۆشبون هەر لە خوا بکەن و، دڵنیا بن ئەو خوایە لێخۆشبو میهرەبانە﴾المزمل ٢٠.

# ئەم فەرمودانەی لە بارەی شەو نوێژەوە هاتون

١ـ عَنْ زياد قال: سَمِعْتُ الْمُغِيرةَ رضي الله عنه يَقُول: إنَّهُ كانَ النَّبِيُّ ﷺ لَيَقُومُ لِيُصَلِي حَتَّى تَرِمَ قَدَمَاهُ، فَيُقَالُ لَهُ: (أَفَلا أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً) أخرجه مسلم.

له زیادەوە هاتووە، دەڵێ: گوێم لە مغیرەبو رضي الله عنه دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە شەو نوێژی دەکرد، تا پێیەکانی شەق شەق دەبوون پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو هەموو زۆر لە خۆکردنە لەبەر چی؟ خوای گەورە لە تاوانی ڕابردوو داهاتوت خۆشبووە، پێغەمبەریش لە وەڵامدا فەرمووی: ئەدی نابێ بەندەیەکی سوپاس گوزاربم!

٢ـ عَنْ عبدالله بِنِ عَمْرو بن العاص م أَخْبَرهُ أنَّ رَسُول اللهِ ﷺ قَالَ: لَهُ ((أَحَبُ الصَّلاةِ إلى الله صَلاةُ داود+ أَحَبُ الصِّيام إلى الله صِيَامُ داود، وكَانَ يَنَامُ

نِصْفَ اللَيْلِ، وَيَقومُ ثُلْثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَيَصُومُ يَوْمَاً وَيَفْطِر يَوْمَاً(أخْرجَهُ مُسلم(أَحَبُ الصَّلاةِ) الصَّلاةُ المَحْبوبَة مِنَ النَوَافِل(أَحَبُ الصِّيام) الصِيَامُ المَحْبُوب مِنَ التَطَوُع)).

عەبدولاّی کوڕی عەمری کوڕی عاس هەواڵی داوە: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: خۆشەویسترین نوێژی لای خوا نوێژی داود پێغەمبەرە، هەروەها خۆشەویسترین ڕۆژو لای خوا ڕۆژوی داودپێغەمبەرە لای خوای گەورە، پێغەمبەر داود÷ نیوەی دەنوست، سێیەکی هەڵدەستاوە بۆ شەو نوێژ، شەش یەکی شەو دەنوست، هەروەها پێغەمبەر داود ڕۆژێك بە ڕۆژو دەبو، ڕۆژێکیش بە ڕۆژوو نەدەبو، مەبەست لە نوێژ و ڕۆژوی سوننەتە.

٣ـ عَنْ شعبة سَمِعْتُ مسروقاً قَالَ: سَأَلْتُ عائشةل: أي الْعَمَلِ كَانَ أَحَبُ إلى النَّبِي قَالَتْ الدّائِمُ، قُلْتُ مَتى يَقُومُ؟ قَالَت إذا سَمِعَ الصُراخ. أخرجه مسلم.

لە شوعبەوەهاتووە، دەڵێت: گوێم لە مەسروق بوو، وتی: پرسیارم لە عائیشە کرد، چ کردەوەیەك لای

پێغەمبەر خۆشەویست بوو؟ عائیشە وتی: بەردەوام بوون لەسەری شەو نوێژ، هەروەها دەڵێت: ووتم: پێغەمبەر کەی بۆ شەونوێژ هەڵدەستا؟ ووتی: کاتێ گوێی لە دەنگی بانگدەر دەبو.

بانگدەر مەبەست کەڵەشێرە، چونکە لە شەو دا زۆر بانگ دەدات، وترایە: زۆربەی جار لە نیوەی شەو بانگ دەدات.

٤ـ عَنْ أبي هوريرةرضي الله عنه أنَّ رَسُولُ اللهِﷺ قَالَ: يَعْقِدُ الشَيْطَانُ عَلَى قَافِيةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إذا نَامَ ثَلاثُ عَقَدٍ يَضْرِبُ كُلَ عَقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيلٌ طَوِيلٌ، فَأَرْقِدْ فَإِنْ إِسْتَيْقَظَ فَذكَرَاللّهُ إنْحَلَتْ عَقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَأَ إنْحَلَتْ عَقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى إنْحَلَتْ عَقْدَةٌ، فَأَصْبَحَ نَشِيطاً طَيْبُ النَفْسِ، وإلا أَصْبَحَ خَبِيثُ النَفْسِ كَسْلان.

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر فەرمووی: کاتێ یەکێ لە ئێوە دەنوێت: شەیتان سێ گرێ لە پشت ملی دەدات، پێی دەڵێت: بنو شەو درێژە، ئەگەر هەستا یادی خوای کرد، گرێیەك دەبێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی

هەڵگرت، گرێی دووەم دەبێتەوە، ئینجا لە کاتی نوێژ گرێی سێیەم دەبێتەوە، کە ڕۆژ دەکاتەوە چالاك و خاوەن دەرونێکی ئارامە، گەر ئەم شتانە نەکات، خاوەنی دەرونێکی ناخۆشی سست، سەرزەنشتی خۆی دەکات، چونکە کەم تەرخەم بوە لە جێبەجێ نەکردنی چاکەو هەڵسان بۆ شەونوێژ.

# کاتی شەونوێژ و ژمارەی ڕکاتەکانی

١ـ کاتی شەو نوێژ لـە دوای نوێـژی عیشـاوە، تـا بەیانیە، پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: ((إِنَّ اللهَ زَادَكُم صَلاةً، وَهِيَ الوِتْرَ، وَيُفَضِـلَ أنْ يَقُـومَ الُمسْـلِمُ فِـي الثُلـثَ الأخِير مِنْ اللَيْلِ)).

خوای گەورە نوێژێکی بۆ زیادکردوون، ئەویش نوێژی ویترە، ئەم نوێژە بکەن لە نێوان نوێژی عیشا، تا نوێژی بە یـانی، باشـترە موسـڵمان لـە سـێ یـەکێ کۆتـایی هەڵسێت بۆ ئەم نوێژە، چونکە چـەند فەرمودەیـەك لـە بارەی گەورەی هەڵستان بۆ شەو نوێژ لە کۆتـایی شـەو ڕیوایەت کراوە.

ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر فـەرمووی: ((يَنْـزِلُ رَبَنـا تَبَـارَكَ وَتعَـالى كُـلَ لَيْلـةٍ إِلى السَّماء الدُنيَا حِينَ يَبْقى ثُلُثُ اللَيْـلِ الآخـر فَيَقُـولُ: مَـنْ يَـدعُونِي أسْـتَجِيبْ لـه؟ مَـنْ يَسْـألِني فَأعْطِـهِ؟ مَـنْ

يَسْـتَغْفِرنِي فَـأغفِر لَـهُ؟ فَـلا يَـزَالُ كَـذَلِكَ حَتَّـى يُضِـئَ الْفَجرْ)) متفق عليه هەموو شەوێك پەروەردگارمان لـە سێیەکی دادەبەزێتـە خـوارەوە بـۆ ئاسمـانی دونیـا لـە شەودا.

دەفەرموێت: کێ دوعا بکات لێ قەبوڵ بکەم، کـێ هەیە داوای پێویـستیم لێبکـات بیـدەمێ، کـێ هەیـە داوای لێخۆش بوونم لێبکات، لێـی خۆشـبم، بـەردەوام بەم شێوەیە دەبێت، تا ڕوناکی بەیان.

١ـ لە فەرموودەیەکی تردا هـاتووە عـەمری کـوڕی عەبسـە دەڵێـت: گـوێم لـە پێغەمبـەری خـوا بـوو دەیفەرموو: ((أقْرَبُ مَا يَكُونُ الرَّبُ مِنَ الْعَبْدِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ الآخِر، فَإِن اسْتَطَعْتَ أَنْ تَكُونَ مِمَـنْ يَـذْكُرالله فِـي تِلْكَ السَاعَةَ فَكُـن)) الترمـذي، وأبـو داود، والنسـائي، وصححه الألباني.

پەروەردگار لـەکۆتایی شـەودا لەهـەموو کـات لـە بەندەی نزیکترە، ئەگەر دەتوانی لەم کەسانە بێـت لـەم کاتەدا یادی خوا بکەیت ئەوالەم کەسانەبە.

هەروەها لە فەموودەیکی تردا هاتووە: عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ سَمِعْتُ رَسُولُ اللهِ ﷺ إنَّ فِي اَللَيْلِ سَاعَةً لا يُوافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللهُ خَيْراً مِنْ أَمْرِ الدُنْيَا إلا أعْطَاهُ إِيَاهُ، وَذلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ. رواه مسلم.

جابر دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا دەیفەرموو: بە ڕاستی لە شەوا کاتێک هەیە هەر بەندەیەکی موسڵمان لەم کاتەدا داوای کاری دونیا کات خوای گەورە پێی دەبەخشێت، ئەم کاتەش لە گشت شەوێکدا هەیە.

٢ـ ئەو کەسەی بیەوێ شەو نوێژ بکات، پێویستە لە کاتی نوستن نیەتی شەو نوێژ بهێنێت، عائیشە دەفەرمووێت: پێغەمبەر فەرمووی: ((مَامِنْ إمْرِئٍ تَكُونُ لهُ صَّلاةً فَغَلَبَهُ عَلَيْهِ نَومٌ إلا كَتَبَ اللهُ لَهُ أَمْرَ صَلاتِهِ، نَوْمُه صَدَقَةٌ عَلَيْهِ.

پێغەمبەر دەفەرمووێت: هەر کەسێ شەو نوێژی هەبوو لە شەودا وخەو زۆری بۆ هێنا خوای گەورە پاداشتی ئەم نوێژەی بۆ دەنوسێت، نوستنی ئەم کەسە چاکەیە بۆی.

٣ـ لە كاتی هەڵسان لەخەو موسڵمان دە ئایەتی كۆتایی سورەتی ئالی عمران بخوێنێت، ئیبن عەباس دەڵێت: ((إِسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللهِ فَجَعَلَ يَمْسَحُ النَوْمُ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ ثُمَّ قَرأَ)) متفق عليه پێغەمبەر لە خەو هەڵسا دەستی بە دەم و چاوی دادەهێنا، پاشان دەئایەتی كۆتایی سورەتی ئالی عمرانی خوێند.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا

وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ
رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾
فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم
مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ
وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ
وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ
عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ
وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ
ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ
ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ

أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ
ثَمَنًا قَلِيلًاۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْۗ
إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ
تُفْلِحُونَ ...

بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویداو ئاڵ و گۆڕی شەورۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند* ئەوانەی یادی خوادەکەن لەکاتێکدا، کە بە پێوەن، یان دانیشتون، یان ڕاکشاون (لە هیچ حاڵێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیر لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە(بیر دەکەنەوە لەهەموو وردەکاریەك، سەرنجی هەموودیاردەیەك دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن: پەروەردگارا تۆ ئەم دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردەوە، پاکیی و بێگەردی شایستەی تۆیە،

دەتۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ* پـەروەردگارا بەڕاستی هەرکەس بخەیتە ناو ئاگری دۆزەخـەوە، ئـەوە ئـیتر شـەرمەزارو ڕیسـواو خەجاڵـەتت کـردوە، (جـا بێگومان لەوێ) ستەمکاران هـیچ جۆرەپشـتیوانێکیان نیـە* پـەروەردگارا بەڕاسـتی ئێمـە گوێمـان لـە بانگخوازێك بوو، بانگی کـردین بۆئیمـان ودەیفـەرمو: ئیمان بهێـنن بەپـەروەردگارتان، جـا ئێمـەش بـێ دوو دڵی، خێرا باوەڕمان هێناو وتمان: پەروەردگارا: دەتـۆش لە گوناهو هەڵەکان خـۆش ببـە، چـاوبکە لـە کـردارە ناپەسەندەکانمان و لە سەر ڕێبازی چاکان و بەختـەوەران بمانمرێنەو لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە* پەروەردگارا، ئـەو بەڵێنانـەشمان بـۆ ئـەنجام بـدە، کەلەسـەر زاری پێغەمبەرانتدا بـە ئێمـەت داوە، کـە سـەرکەوتنە لـە دونیـاداو بەهەشـتی بەرینـە لـە داهـاتوو و لـە ڕۆژی قیامەتیشدا خەجاڵەت و ڕوو زەردمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن شکێن نیت و بەڵێنی خۆت دەبەیتـە سـەر* کاتێـك ئیمانـداران بـەم شـێوەیە نزایـان کـرد، کـە

پەروەردگاری ئازیزیان فێریان دەکات، بێگومان ئەو زاتە دوعاکانیان لێوەردەگرێت بەهاناو هاواریانەوە دەچێت بۆیە دەفەرموێت: بەڕاستی من هەوڵ و کۆشش و کاروکردەوەی هیچ کام لە ئێوە بەزایە نادەم، چ نێرینە و پیاوتان، چ مێینەو ئافرەتتان، چونکە هاوکاری یەکتر بون، لە چاکەوچاکەکایدا، جانەوانەی کۆچیان کردو لە شوێنەواری خۆیان دەربەدەرکران و ئازار و ئەشکەنجەدران لە پێناوی مندا و جەنگان و شەهیدکران، بەڕاستی سوێند بێت چاوپۆشی دەکەم لە هەڵەو گوناهەکانیان و دەیانخەمە باخەکانی بەهەشتەوە، کە چەندەها ڕوبارو بەژێر درەختەکانیەوە دەڕوات، ئەمەش پاداشتێکە لە لایەن خواوە پێشکەشیان دەکرێت، خوا پاداشتی چاك و جوانی لایە بۆ تێکۆشەران* ئەوە هەر هەرمووی ڕابواردنێکی کەمە، چونکە لەوەودوا شوێن و جێگەیان دۆزەخە، کە ناخۆشترین جێگەو ڕێگەیە* بەڵام ئەوانەی، کە پارێزکارن و لە سزای پەروەردگاریان دەترسن (جێگەو

ڕێگەیان) باخـەکانی بەهەشـتە، کـە چـەندەها ڕووبـار بەژێر درەختەکانیداو بەبـەردەم کۆشـکەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی لەوێـدا ئەوشـوێنانەش لە لایەن خواوە ئامادەکراوە، بۆ میوانداری هەمیشەیی بەختەورن، ئەڵبەتە ئەوبەشەی، کـە لای خوایـە چـاکتر وبەنرخترە بۆ چاکەکاران و خواناسان* بەڕاستی هەندێ کەس هەن لە خاوەنانی کتێب، کە باوەڕی بەخوا پتەو و دامـەزراوە، هـەروەها بـەو قورئانـەش، کـە بـۆ ئێـوە ڕەوانـــەکراوەو بـــەو کتێبانـــەش بۆخۆیـــان پێشـــتر ڕەوانەکراوە، لەکاتێکدا ئەوانە ترسی خوایان لەدڵدایە و مەبەستیانە خوا لێیـان ڕازی بێـت، ئایەتـەکانی خـوا نرخێکی کەم(یاخود بەهیچ نرخێـك) نافرۆشـن، ئەوانـە پاداشتی(ئیمـان وبـاوەڕی) خۆیـان لای پـەروەردگاریان وەردەگرن، بەڕاستی خوا بە خێرایی لێپرسینەوە ئەنجام دەدات (تا بەزویی بخاتە بەهەشتەوە وناپوختەکانیش لە دۆزەخ تونـد بکـات* ئـەی ئەوانـەی، کـە باوەڕتـان هێنـاوە، خـۆگربن و خـۆڕاگریی ونـارامگری بەسـەر

خۆتانــدا بهێــنن، نەبــەز لــە خــۆگری مانــەوەتان لــە سەنگەردا، هەوڵ بدەن هەمیشە لە سەنگەری خەبات و کۆششدا بن، لە خوا بترســن و پارێزکــاربن بــۆ ئــەوەی ســەرفرازی (هەمیشــەیی) بەدەســت بهێــنن)﴾ ١٨٩ــ ٢٠٠ال عمران.

# زیکرەکان و هەڵسان لە خەودا

٤ـ پێغەمبەری خوا شەو نوێژی بە دوو ڕکات نوێژی کورت دەست پێدەکرد، لەم بارەوە فەرمودەك هاتووە:

عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ إِذا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ إفْتَتَحَ صَلاتَهُ بِركَعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ)).

عائیشە دەڵێت: کاتێ پێغەمبەرﷺ لە شەوا هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ بە دوو رکات نوێژی کورت دەستی بە شەو نوێژ دەکرد.

٥ـ ژمارەی ڕکاتەکانی شەو نوێژ دیاری نەکراون، بەڵام باشتر وایە کورت بکرێتەوە بۆ یازدە ڕکات، یا سیانزە ڕکات، ئەمەش بەگوێرەی فەرمودیە.

عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ كَانَ يُصَلِي إِحْدَى عَشَرَةَ ركْعَةً، كَانَتْ تِلْكَ صلاةٌ تَعْنِى بِالْلَيْلِ فَيَسْجُدُ السَجَدَةَ مِنْ قَدْرِ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسُ آيةٍ قِيلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، وَيَركَعُ رَكَعَتَيْنِ فَبَد صَلاةَ الفَجْرِ ثُمَّ إِضْطَجَعَ عَلَى شِقِهِ الأيْمَنِ.

عائیشــە دەڵێــت: پێغەمبــەر یــانزە ڕکـات نوێـژی دەکرد، ئەمە نوێژی پێغەمبەر بووﷺ، واتە: پێغەمبەر سوجدەی دەبرد، بە ئەندازەی خوێنــدنی پــەنجا ئایــەتی ئێوە بەر لەوەی سەر بەرز بکاتەوە، ئینجـا دوو ڕکـات نوێژی پێش بەیانی دەکـرد، پاشـان لەســەر لای ڕاسـت پاڵی دەداوە تا بانگبێژ بۆ نوێژ دەهات.

٦ـ موسـڵمان دوو ركـات، دوو ركـات شـەو نوێـژ دەكـات، یـەك ڕكـات ویـریش دەكـات. پێغەمبــەر دەفەرموێت: ((صَلاةُ اللَّيْلِ مَثْنى مَثْنَـى فَـإذا خَشْـيَ أَحَدُكُمْ الصُبحَ وَاحِدَةً تَوتَرَ مَا قَدْصَلَى))رواه البخـاري با موسڵمان شەو نوێژ دوو، دوو ركات بمات، ئەگەر یـەكێ لە ئێوە ترسی هاتنی بەیانی هەبوو، با ركاتێك بكـات ئەم نوێژەی كردویەتی بۆی دەبێت بەویتی.

عن عائشة قالت: كُلُ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ وَانْتَهَـى وِتِرِ اِلى السَحَرِ. رواه البخاري

پێغەمبەر لــە هــەموی شــەودا شــەونوێژی دەكـرد. واتە: پێغەمبەرﷺ لــە گشــت كاتــەكانی شــەو ویـتری

دەکرد، ویتر کاتێکی دیارکاروی نەبو بۆ ئـەوەی ویـتری تێدا بکات.

هەروەها لە فەرموودەیەکی ترهـاتووە پێغەمبـەرﷺ فەرمویەتی: إِجْعَلُوا آخِرَ صَلاتِكُمْ وِتْـراً. با کۆتا نوێژتان لە شەودا ویتر بێت.

٧ـ بۆ خوێندنی قورئان لە نوێژی ویتر سـوننەتە لـە ڕکـاتی یەکـەم: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ بخـوێنی، لـە ڕکاتی دووەم ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ لـە ڕکـاتی سێیەم: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾ بخوێنێت، هەنـدێ جـار هـەردو سـورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ دەخوێنیت.

لە فەرموودەیەکی صـەحیح دا هـاتووە، جارێکیـان پێغەمبەر لە ڕکاتێکی ویتر سەد ئایـەتی لـە سـورەتی نیساء خوێندوە.

لـە بـارەی دوعـای قنوتـەوە، کـە پێغەمبـەر، کورەزاکەی حەسەنی کوڕی علی فێری کردووە ئەوەیە:

(اللَّهُمَ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَ تَوَلَنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَّرَ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَكَ تَقْضِي وَ لايُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لا يَذِلُ مَنْ وَالَيْتَ، وَلايَعِزُ مَنْ عَادَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ، لامُنْجَاً مِنْكَ إلا إِلَيْكَ).

واتە: خوایە ڕێنموینم بکە لەگەڵ ئەوانە، کە ڕێنمونیت کردون، پارێزراو ولەش ساغم بکە لەگەڵ پارێزراواندا، پشتم بگرە لەگەڵ پشتگیری لێ کراواندا، لەوەی دەیبەخشیت پێم، بەرەکەتی تێ بخەو، لەخراپەی ئەوەی بڕیارت لەسەری داوە بمپارێزە، تۆ بڕیار دەدەیت، کەس بڕیارت لەسەر نادات، ئەوەی تۆ پشتی بگریت هەرگیز زەبون نابێ، ئەوەی تۆ دوژمنایەتی بکەی، هەرگیز بەعیزەت و بەدەسەڵات نابێ، پاکی و بێ گەردی و بەرزو بڵندی بۆ تۆیە پەروەردگارمان، هیچ کەسێك نیە دەربازمان کات لە تۆ، تەنها خۆت نەبێت.

هەروەها علی کوڕی ئەبی تالیب گێراویەتەوە، پێغەمبەر دەیفەرموو: اللَّهُمَ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ

سَخَطِكَ، وَبِمَعَافَاتِكَ مِـنْ عُقُوبَتِـكَ، وَأَعُـوذُ بِـكَ مِنْـكَ، لاأُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ" رواه أحمد في المسند والنسائي، وأبو داود والترمذي، إبن ماجة.

واتە: خوایە پەنادەگرم بە ڕەزامەندی تۆ لە خەشم و توڕەبونت، پەنا ئەگرم بەلێ بوردەیت لە سزادانت، پەنا ئەگرم پێت، ستایشم بۆت ناژماردرێ، تۆ بەو جۆرەی، کەخۆت وەسف و ستایشی خۆتت کردەوە....

لە پێغەمبەرەوە هاتووە لە بارەی شوێنی قنوتەوە، پێش چونە ركوع، هەروەها دوای چونە ركوعەوە، هەر دوکیان شەرعین، بەلاَم باشترە فنوت دوای رکوع بێت، چونکە زۆربەی فەرموودەکان لە بارەی دوای ڕکوعن، هەروەها قنوت لە ویتر سوننەتە.

# سوننەتە بەندە لە قنوت دەستی بەرزبکاتەوە

عَـنْ رَسُـولِ اللهِ قَـالَ إِنَّ رَبَّكُـمْ تُبَـارَكَ حَيْـيٌّ كَـرِيمٌ يَسْتَحِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّ مِمَا صَـفْراً. رواه أبو داود و الترمذى و إبن ماجه.

پێغەمبەر دەفەرمووێت: پەروەردگاتان زندوە و بەخشندەیە، شەرم لە بەندەکەی دەکات، کاتێ دەست بەرز دەکاتەوە بە دەست بە تاڵی ڕەتی کاتەوە.

سوننە لە کۆتایی نوێژی ویتر پێش سەلامدانەوە بڵێت: ((اللَّـهُمَ إِنِّـي أَعُـوذُ بِرِضَـاكَ مِـنْ سَـخَطِكَ، وَبِمَعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُـوذُ بِكَ مِنْكَ، لاأُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْبَتَ عَلَى نَفْسِكَ)).

لە نوێژی ویترا کاتێ سەلامی داوە، سێ جار بڵێت: سُبْحَانَ الْمَلِكُ الْقُدُوسْ، دەنگی درێژکاتەوە لە کۆتایی بڵێت رب الملائکەوالروح.

٨ـ بەردەوام بون لەسەر شەو نوێژ بێ پچڕانەوە، سوننەتە موسڵمان ژمارە ڕكاتەكانی دیار بێت، بۆ ئەوەی لەسەری بەردەوام بێت ، كاتێ چالاك بێت درێژی بكات، ئەگەر چالاك نەبو كورتی بكات، ئەگەر لە دەستی چوو بیگێرتەوە لەم بارەیەوە ئەم فەرمودە هاتوە:

عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِي قَالَ: خُذُوا مِنَ الأعْمَالِ مَا تَطِيقُونَ فَإِنَّ اللهَ لا يَمِلُّ حَتَّى تَمِلُوا وَكَانَ يَقُولُ أَحَبُ الْعَمَلِ إلى اللهِ مَادَامَ عَلَيْهِ صَاحِبَهُ وَإنْ قَلَّ. متفق عليه.

عائیشە گێڕاویەتەوە، پێغەمبەر دەیفەرمو ئەوەند كردەوە بكەن، كە لە تواناتاندایە خوا بێزار نابێ، هەتا ئێوە بێزار نەبن.

هەروەها دەیفەرمو خۆشەویسترین كار لای خوا ئەوەیە خاوەنەكەی لەسەر بەردەوام بێت.

عبداللە كوڕی عمری كوڕی عاص دەڵێت: پێغەمبەر پێی ووتم: يَا عَبْدُاللهِ لاتَكُنْ مِثْلَ فُلانٍ كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ

فَتَرَكَ قِيَام اللَّيْلِ متفق عليه.

ئەی عەبدوولا فلانە کەس مەبە، شەو هەڵدەستێت شەو نوێژ ناکات.

عائیشە دەفەرموێت: كَانَ رَسُولُ اللهِ إذا صَلَى صَلاةً أَحَبُّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهَا، وكَانَ إِذَا غَلَبَهُ نَوْمٌ أَوْ وَجَعٌ مِنْ قِيَامِ اللَّيْلِ صَلَى مِنَ النَهَار ثِنْتَيْ عَشَرَ رَكْعَةً. رواه مسلم.

کاتێ پێغەمبەر شەو نوێژی دەکرد حەزی دەکرد بەردەوام بێت، خەویا، ژان زۆری بۆ دەهێنا لە شەو نوێژ، لە ڕۆژدا دوازدە رکاتی دەکرد.

# سودەکانی شەو نوێژ

لــە کتێبــی (الوصــفات المنزلیــة التجربــة و اســرا شــفاءالطبعیة) ، کــە کتێبێکــی ئینگلزیــە کۆمــەڵێك نوسەری ئەمریکی لــە ســاڵیَ ١٩٩٣ چــاپیان کــردوە، تێیدا هاتوە هەڵسان لەسەر جێگا لەو شەودا و جوڵــەی ئاسایی لــە مــاڵ، هــەروەها هەنــدێ وەرزشــی کــەم و خۆشۆردنی و هەناسەدان بە قوڵی چەندین سودی جۆراو جۆری هەیە، بیرکردنــەوە لــەم ئامۆژگاریانــە هاوێنــەی شەو نوێژە، لە جوڵە دەســتنوێژ لــە کــاتی شــەو نوێــژ پێغەمبەر بۆ ئەمانە ئاماژەی بەو شەو نوێــژ کردنــەوە، پێغەمبەر دەفەرموێت: عَلَـيْكُمْ بِقِيَـامِ اللَّيْـلِ فَإِنَـهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُم وَ قُرْبَةٌ إِلَى اللهِ عَزَوَجَلْ وَ مُنْهَـاةُ الأثـم و تَكْفِيرُ لِلسَيْئَاتِ وَ مُطَرِدَةٌ لِلْدَاءِ عَنِ الْجَسِدِ.

بە شەو نوێژەوە پابەندبن، چونکە کاری پیاو چاکانی پێشوتانە، هەروەها نزیکتان دەخاتەوە لە خوای گــەورە دورتــان دەخاتــەوە لــە تــاوان، گوناهتــان لا دەبــات،

نەخۆشی لەلاشەتان دوردەخاتەوە.

لەبارەی چۆنیەتی هەڵسان بۆ شەونوێژ بە دورخستنەوەی نەخۆشی لە لاشەی مرۆڤ بەم شێوە سەلمێنراوە: ئەنجامدانی شەونوێژ ئەبێتە هۆی کەمبونەوەی دەردانی هۆرمۆنی کورتیزۆل (کە کورتیزولی سروشتیە بۆ لاشە) بەتایبەت پێش هەڵسان لەخەو بە چەند کاتژمێرێك، ئەم کاتە هاوکاتە لەگەڵ بەرەبەیان (سەحەر) ـ سێیەکی کۆتایی لەشەو ـ هەروەها دەبێتە هۆی پاراستنی ڕێژەی شەکرە لەخوێن، کە پێکهێنەری ترسناکە لە سەر نەخۆشی شەکرە، بەهەمان شێوە دەبێتە هۆی کەمبونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، هەروەها دەبێتە هۆی پارستنی مرۆڤ لەتوشبون بە نەخۆشی ئیفلیجی و جەڵدەی دڵ.

هەروەها شەونوێژ دەبێتە هۆی کەمبونەوەی ترسناکی لەسەر خەستبونەوەی خۆێنی خوێنهێنەرەکانی تۆڕی چاو، کە دەبێتە هۆی لەسەرخۆ ڕۆیشتنی خوێن بۆ دەمارەکانی تۆڕی چاو لەکاتی نوستن، هەروەها

دەبێتە هۆی زیاتر خەست بونەوەی خوێن بەهۆی کەم خواردنی شلە مەنیەکان، یا زیاتر کەمبونەوەیان.

چەوری زۆری تەنگە نەفەسی لەم هۆکارنەیە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی خوێنی خوێنهێنەرەکانی کاسەی سەر.

هەروەها شەو نوێژ دەبێتە هۆی باشتر بوون و نەرم و نۆڵ بوونی جومگەکانی جەستەی مرۆڤ، جا ئەمە نەخۆشی ڕۆماتیزم بێت، یان نەخۆشی تر، کە بەهۆی جوڵەی لەسەرەخۆ لەکاتی نوێژکردنەکەدا، یان شێلانی ئەو جومگانە بەئاو لەکاتی دەست نوێژ شوشتن.

شەونوێژ چارەسەرێکی سەرکەوتوە بۆئەو نەخۆشیەی ناسراوەبە (ماندوبونی درێژخایەن) نوێژ دەبێتە هۆی ڕێکخستنی جوڵە لەنێوان جوڵەی ئاسایی و ناوەندی، کە جێگیرکردنی کارایی لەچارەسەرکردنی ئەو جۆرە نەخۆشییەیە.

هەروەها دەبێتە هۆی پاراستنی لاشە لە (جلیسیرات الثلاثیة) ـ جۆرێکە لە چەوری ـ لە ناو خوێندا لەسەر یەك کەڵەکە دەبێت بەتایبەت لەدوای خواردنی بڕێکی

زۆر لە چەوری لە نانی ئێوارە. دەبێتە هۆی زیاد بوونی مەترسی لە تووش بوون بە نەخۆشی خوێنبەرەکانی دڵ بە ڕێژەی Percnt &٣٢ بە بەراوردکردن لە گەڵ ئەو کەسانەی کە شەو نوێژ دەکەن، لە مەترسی مردن بە هۆکاری تر. بەتایبەت جەڵدەی مێشك و دڵ هەندێ جۆری شێرپەنجە ، هەروەها دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی مەترسی مردنی لە ناکاو بەهۆی لێدانی دڵ کە هۆکارەکەی هەڵکێشانی هەوای پاك و خاڵی لە پیسی ڕۆژگار، گرنگترینیشیان دوکەڵی ئوتومبێلەکان.

شەونوێژ دەبێتە هۆی چالاکبوونی بیری مرۆڤ و ئاگادارکردنەوەی مۆخی مێشك، چونکە شەو نوێژو قورئان خوێندن و بیرکردنەوە لە قورئان و پاڕانەوە یادی خوای تێدایە.هەروەها گەڕانەوەشە بۆ زیکری بەیانیان و ئێواران. شەو نوێژ دەبێتە هۆی پاراستنی نەخۆشیەکانی لەبیرچونەوە لەکاتی پیری و خەمۆکی.

لەکۆتاییدا شەو نوێژ دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی نەخۆشی زرنگانەوەی گوێچکە لەبەر چەند هۆکارێکی نەزانراو.

# ناوەڕۆك